زنجیرەی جوانترین چیرۆك لە فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)

# كەچەڵ و بەڵەك و نابینایەكە



المكتب الاسلامي
AL-Maktab AL-Islami

ناشرين



الدار العربية للعلوم

نـــــــاوی کتێـــــــب:   زنجیرەی جوانترین چیرۆك لـە فـەرموودەکانی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ): هاوەڵانی کەشتییەکە
نـــــووسیـــنـــــــی:   شادی فقیه
وەرگێـــــــڕانـــــــی:   سەردار ڕەزا
پێداچوونەوەو هەڵەچنی:   محەمەد مێرگەیی
نـەخشەسازی نــــاوەوە:   محمد علی احمد
ســــــاڵی چــــــــاپ:   ٢٠١٠ ز
شـــوێـنـی چـــــــاپ:   بەیروت ـ لوبنان
ژمـــــارەی سـپـــــاردن:   (١١٢٥)ی ساڵی ٢٠٠٩ی پێدراوە

بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی
پێگەی ئەلیکترۆنی: www.nareenco.com
E-mail: nareen@nareenco.com
تەلەفۆن: ٢٥١١٩٨٢ ٦٦ (٠٠٩٦٤)
مۆبایل: ٠٠٩٦٤ ٧٥٠٤٠٦٤٦١٠

الدار العربية للعلوم

المكتب الاسلامي

زنجیرەی

جوانترین چیرۆك

لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)

# کەچەڵ و بەڵەك و نابینایەکە




نووسینی

شادی فقیه

وەرگێڕانی

سەردار ڕەزا





الدار العربية للعلوم

Arab Scientific Publishers

المكتب الاسلامي

AL-Maktab AL-Islami

بایەکــە خشەخــشی بــە گــەڵای درەختــەکان خــستبوو، دەنگێکی خۆشیانی لێ سازکردبوو، وەك ئەوەی سروودی ناسکی دەمەو ئێوارانە و پێشوازی لە مانگ و ئەستێرەکانی ئەو شەوە دەکات.

وەکو هەموو شەوانێکی تر ئیبڕاهیم و فاتیمەی خوشکی لە دەوری باوکیان کۆبوونەوە بۆ ئەوەی ئەمشەویش چیرۆکێکی تازە و جوانیان لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ بگێڕێتەوە.

منداڵەکان: سڵاوت لێبێت بابە گیان.

باوك: سڵاو لە ئێوەش خۆشەویستەکانم.

فاتیمە: چیرۆکی ئەمشەومان باسی چی دەکات؟

باوك: باسی کەچەڵێك و بەڵەکێك و نابینایەك دەکات.

ئیبراهیم: کەچەڵێك و بەڵەکێك و نابینایەك؟

باوك: بەڵێ، ئەوە چیرۆکێکە پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕاویەتییەوە بۆ هاوەڵەکانی.

فاتیمە: بابەگیان، کەواتە تۆش بۆ ئێمەی بگێڕەرەوە.

**باوك**: لە سەردەمی زوودا کەچەڵێك و بەڵەکێك و نابینایەك هەبوون. ئەو سێ پیاوە بەو بەڵایە ڕازی نەبوون، کە پێوەی گیرۆدە ببوون، بۆیە هەموو بەیانیان و ئێوارانێك لە خوای پەروەردگار دەپاڕانەوە چاکیان بکاتەوە و باریان بگۆڕێت. ئەو نەخۆشییە ناخۆشەیان لەسەر لابەرێت.

**کەچەڵەکە**: خوایە ئەم کەچەڵییەم لەکۆڵ کەیتەوە، ئەم حاڵە خراپەم بۆ بگۆڕیت.

**بەڵەکەکە**: خوایە گیان چاکم بکەیتەوە.

**نابینایەکە**: خوایە بینایی بۆ چاوەکانم بگێڕیتەوە، تا چاوم ببینن.



باوك: خوای پەروەردگار نزا و پاڕانەوەکانی لێوەرگرتن و فریشتەیەکی لە شێوەی پیاوێکدا نارد بۆ لایان، فریشتەکە ڕۆیشت بۆ لای بەڵەکەکە و لێی پرسی: براکەم تۆ ئاواتەخوازی چیت؟

بەڵەکەکە: ئاواتەخوازی ئەوەم خوای پەروەردگار شیفام بدات و لەم نەخۆشییە ڕزگارم بکات و ئەم پەڵانە لەسەر پێستەکەم نەهێڵێ و لە چاکەی خۆیەوە دەوڵەمەندم بکات.

فریشتەکە: ئەوا خوای پەروەردگار پاڕانەوە و دوعاکەی لێوەرگرتیت، من لە لایەن خوای پەروەردگارەوە نێردراوم، تاکو ئەو مژدەیەت پێ بدەم. ئەو حوشترەش بۆ تۆ بێت بۆ ئەوەی سوود لە شیر و گۆشەکەی وەربگریت و خوای پەروەردگار لە بەخشندەیی خۆیەوە دەوڵەمەندیشت دەکات، بەڵام خەڵکی هەژار و نەدارەکانت لەبیرنەچیت، ها...!

پیاوەکە: خوایە گیان سوپاس و ستایشی بێ پایانم بۆ تۆ، ئۆخەی ئەوا چاک بوومەوە، ئەی نێردراوی پەروەردگار زۆر زۆر سوپاس بۆ تۆ مەمنونتم.

**باوك:** پاشان فریشتەکە ڕۆیشت بۆ لای کەچەڵەکە و لەبارەی ئاوات خواستنەکەیەوە لێی پرسی.

**کەچەڵەکە:** ئاواتم ئەوەیە ئەم کەچەڵییەم نەمێنێت و قژی سەرم بڕوێتەوە، هەروەها خوای پەروەردگار ماڵ و سامانم پێ ببەخشێت و پێویستم بە خەڵکی نەمێنێت.

**فریشتەکە:** خوا وەڵامی داواکارییەکەی دایەوە، منیش نێردراوی لای خوام و هاتووم ئەو مژدەیەت بدەمێ، ئەو مانگایەشم بۆ هێناوی تاکو لە گۆشتەکەی بخۆی و لە شیرەکەشی بخۆیتەوە.

**کەچەڵەکە:** پەروەردگارا سوپاس و ستایش بۆ تۆ، چەند خۆشە وا قژی سەرم هاتەوە، زۆر سوپاس بۆ تۆ ئەی نێردراوی خوا.

باوك: پاشان فریشتەکان ڕۆیشتن بۆ لای پیاوی سێهەم، کە نابیناکە بوو، لەبارەی ئاواتەخوازییەکەیەوە پرسیاری لێکرد.

نابینایەکە: ئاواتەخوازم خوای پەروەردگار بینایی بۆ چاوەکانم بگێڕێتەوە تا پێی ببینم و لە چاکی خۆیەوە دەوڵەمەندم بکات.

فریشتەکە: خوای پەروەردگار ئاواتەکەتی هێنایەدی و من لەلایەن خواوە هاتووم بۆ لات بۆ ئەوەی ئەم مژدەیەت پێ بدەم، ئەو مەڕەش وەربگرە بۆ خۆت و لە شیرەکەی بخۆرەوە و لە گۆشتەکەشی بخۆ.

نابینایەکە: پەروەردگارا سوپاس و ستایش بۆ تۆ، وا چاوەکانم چاك بوونەوە و ئێستا دەبینم. خوایە گیان زۆر سوپاست دەکەم، کە چاوەکانم ڕۆشناییان تێکەوت.

**باوك**: هەرسێ پیاوەکە چاکبوونەوە، سەروەت و سامانیان زۆر بوو، دەوڵەمەند بوون، هەریەکەیان بوونە خاوەنی شیو و دۆڵێك لە ئاژەڵ، خوای پەروەردگار، کە خۆی زانایە بە دڵ و دەروونیان، بەڵام هەر ویستی کەوا تاقییان بکاتەوە، ئایا سوپاسگوزاری خوان لەسەر ئەو ناز و نیعمەتانەی پێی بەخشیوون. ئایا ڕێز لە هەژار و نەداران دەگرن و چاکەیان لەگەڵدا دەکەن.

خوای پەروەردگار بۆ لای هەریەکەیان فریشتەیەکی نارد لە شێوەی نەخۆشییەکەی جارانی ئەواندا.

بەڵێ ... فریشتەی یەکەم لە شێوەی پیاوێکی بەڵەکدا هات بۆ لای ئەو پیاوە بەڵەکەیان، کە خوا چاکی کردبوویەوە، فریشتەکە سڵاوی لێکرد.

**فریشتەکە:** ببوورە گەورەم ئەوە من ڕێگەم هەڵەکردووە و هەژار و نەدارم، ئایا یارمەتیم دەدەیت؟

تەنها داوای یەك وشترت لێدەکەم، کە بمدەیتێ تاکو بمگەیەنێت.

**پیاوە بەڵەکەکە:** ئەی کابرای بەڵەك تۆ چیت لە من دەوێت؟ دیارە تۆ ئەو دۆڵە پڕ لە ئاژەڵەت دیوە و چاوت تێ بڕیوە، خێرا لێم دوور بکەرەوە، هەتا تووشی نەخۆشی بەڵەکییەکەی خۆتت نەکردووم.

فریشتەکە: وابزانم من لەمەوپێش هاتوومەتە لای تۆ، ئەی تۆ ئەو پیاوە بەڵەکە هەژار و داماوە نەبوویت، کە خەڵکی بێزیان لێ دەکردیتەوە، پاشان خوای پەروەردگار شیفای دایت و چاکی کردیتەوە، ئەو هەموو سامان و ئاژەڵەشی پێ بەخشیت.

پیاوە بەڵەکەکە: تۆ درۆت کرد ئەم ماڵ و سامانەشم لە باوکمەوە بە میراتی بۆ ماوەتەوە، من خۆم هەر دەوڵەمەندی کوڕی دەوڵەمەند بووم و هیچ کاتێکیش من بەڵەک نەبووم.

فریشتەکە: ئەگەر درۆزن بیت ئەوا وەکو جارن بەڵەك و هەژار دەبیتەوە، فریشتەکە چۆنی گوت هەر وا دەرچوو، پیاوەکە پێستی پەڵە پەڵە بووەوە و دیسان بەڵەك بوویەوە و هەژار کەوتەوە، لەبەر ئەوەی ناسوپاسگوزاریی و کوفری کرد بەرامبەر بەو ناز و نیعمەتەی خوای پەروەردگار پێی بەخشی بوو...

باوك: پاشان فریشتەكە لە شێوەی پیاوێكی كەچەڵدا ڕۆیشت بۆ لای پیاوی دووهەم، چۆن داوای یارمەتی لە پیاوی یەكەم كرد بە هەمان شێوەش داوای یارمەتی لەمیش كردەوە، هەمان گفتوگۆش لە نێوان ئەماندا ڕوویدایەوە.

پیاوە كەچەڵەكە: من ئەو سەروەت و سامان و ئاژەڵانەم لە باوكمەوە بە میراتی بۆ ماوەتەوە و هیچ كاتێكیش لەمەوپێش كەچەڵە نەبوویمە.

فریشتەكە: ئەگەر درۆ بكەیت ئەوا خوای پەروەردگار وەكو جارن كەچەڵت دەكاتەوە و ماڵ و سامانەكەشت لێ دەسێنێتەوە و هەژار دەكەویتەوە.

فریشتەكە چۆنی گوت هەر وا دەرچوو. خوای پەروەردگار لە پیاوەكە ناڕازی بوو، گەڕاندییەوە بۆ باری جارانی، واتە: ماڵ و سامانەكەی لێ سەندەوە و نەخۆشی كەچەڵییەكەشی بۆ ناردەوە و كابرا كەچەڵ بوویەوە، لەبەرئەوەی بەو ناز و نیعمەتانەی خوا پێی بەخشی، لە خۆی گۆڕا و خۆی بەزلزانی و كوفر و ناشكوری كرد بەرامبەر بە نیعمەتەكانی خوای پەروەردگار.

**باوک:** پاشان فریشتەکە لە شێوەی پیاوێکی نابینادا ڕۆیشت بۆ لای ئەو پیاوەی جاران نابینابوو، چاوی چاک ببوویەوە و دەوڵەمەند ببوو، فریشتەکە داوای خێری لێکرد.

**فریشتەکە:** ئەی پیاو چاک داوات لێ دەکەم خواردنم بدەیتێ، من هەژار و نەدارم و ڕێبواریشم، باری ژیانم وای لێکردووم بگەمە ئێرە، داوات لێدەکەم لەبەر خاتری ئەو خوایەی چاوتی چاک کردۆتەوە، لە سامانەکەت یەك مەڕم پێ ببەخشیت، تا لە سەفەرەکەمدا سوودی لێ ببینم.

**نابیناکە:** فەرموو برا شیرینەکەم، من کاتی خۆی نابینابووم خوای پەروەردگار بە ڕەحم و سۆزی خۆی چاوی چاك کردوومەتەوە. ئێستا من دەزانم تۆ هەست بە چ خەم و ئازارێك دەکەیت، ئەو دۆڵەی وا لەبەر دەمتدایە، ئاژەڵێکی زۆری تێدایە، بڕۆ بە ئارەزووی خۆت کام مەڕت بەدڵە هەڵیبژێرە و ببیە، سامان سامان خوایە.

**فریشتەکە:** ئەی بەندەی چاکەخواز ماڵ و سامانەکەت پێشکەشی خۆت بێ، من لەلایەنی خوای پەروەردگارەوە نێردراوم، هاتووم بۆ ئەوەی تاقیت بکەمەوە، خوا لە تۆ ڕازی بووە و لە هەر دوو هاوڕێکەشت ناڕازییە.

**منداڵەکان:** ئای کە چیرۆکێکی خۆشبوو باوکە گیان.

**باوک:** ڕۆڵەکانم! لەبەرئەوە پێویستە هەمیشە سوپاسگوزاریی خوای پەروەردگارمان بین. لەسەر هەموو ئەو ڕزق و ڕۆزییەی پێی بەخشیوین، سوپاسی بکەین و هیچ کاتێك ئەوەمان لەبیر نەچێتەوە، کە چاکە لەگەڵ خەڵکی بکەین و یارمەتییان بدەین، هەروەکو چۆن خوا چاکەی لەگەڵ ئێمەدا کردووە.

## پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:

((إن ثلاثة من بني إسرائيل، أبرص، وأقرعَ، وأعمى، أراد الله أن يبتليَهم، فبعث إليهم ملكاً، فأتى الأبرصَ فقال: أيُّ شئ أحبُّ إليك؟

قال: لونُ حسنٌ، وجلدٌ حسنٌ، ويذهبُ عني الذي قد قذني الناسُ، فمسحه، فذهبَ عنه قذره، وأعطيَ لوناً حسناً.فقال:

فأيُّ المال أحب اليك قال: الإبلُ. فأعطي ناقةً عشراء. فقال: باركَ اللهُ الأقرع، فقال: أي شئ أحبُّ إليك قال: شعرٌ حسنٌ. ويذهب عني هذا الذي قذرني الناسَ. فمسحه، فذهب عنه، وأُعطيَ شعراً حسناً.

قال: فأيُّ المال أحبُّ إليك قال: البقرُ، فأعطى بقرةًحاملاً، وقال: بارك الله لك فيها.

فأتى الأعمى، فقال: أيُّ شئ أحبُّ إليك قال: أن يردَّ الله بصري فأبصرِ الناسَ. فرد الله إليه بصره، قال: فأيُّ المال أحبُّ إليك قال: الغنمُ. فأعطى شاةً والداً، فأنتج هذان وولد هذا، فكان لهذا وادٍ من الإبل، ولهذا واد من البقر، ولهذا واد من الغنم.

ثم إنه أتى الأبرص في صورته و هيئته فقال: رجلٌ مسكين، قد انقطعت بي الحالُ في سَفري. فلا بلاغ لي اليومَ إلاّ بالله، ثم بك. أسألك بالذي أعطاك اللونَ الحسنَ. والجلدَ الحسن والمال. بعيرا أتبلغ به في سفري.

فقال: الحقوق كثيرةٌ. قال: كأني أعرفُك، ألم تكُنْ أبرصَ كابراً عن كابرٍ.

فقال: إن كنت كاذباً فصيرك الله إلى ماكنت.

وأتى الأقرع في صورته و هيئته فقال: له مثل ما قال لهذا، وردَّ عليه مثل ماردَّ هذا. فقال: إن كنت كاذباً فصرك الله الى ماكنت.

وأتى الأعمى في صورته وهيئته فقال: رجل مسكينٌ، وابن سبيل. انقطعت بي الحالُ في سفري. فلا بلاغَ لي اليوم إلاَّ باللهِ بكَ. أسألكَ بالذي رَدَّ عليك بصرك فرد الله إلَيّ بصرى فخذ ماشئت، ودَعْ ما شئت. فوالله لا أجهدك اليوم بشئ أخذته لله عزوجل. فقال: أمسك مالك. فإنما ابتليتم فقد رضيَ الله عنك. وسخطَ على صاحبيك)).

بوخاری گێڕاویەتیەوە (٣٤٦٤)

موسلیم گێڕاویەتیەوە(٢٩٦٤).